بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خودای گەورە کە دوای ماندوبون و هەوڵێکی زۆر یارمەتی داین تاوەکو ئەم کتێبە تەواو بکەین، بەو هیوایەی کە سودی هەبێت بۆ هەموو موسوڵمانێک کە هەوڵی فێربونی تەجوید دەدات.

وە زۆر سوپاسی ئەو ماموستایانە دەکەین کە پێداچونەوەیان کردووە بۆ ئەم کتێبە لە ڕاستکردنەوەی بەشێک لە هەڵەکان، وە پێشنیارکردنی هەندێک بابەتی گرنگ.

ئەم کتێبە بۆ ئەو کەسانەیە کە لە ئاستی سەرەتا یان مام ناوەندی تەجوید دان، وە بابەتەکان زۆر بە سادەیی و ئاسانی باسکراون، کە کەسی خوێنەر دەتوانێت زۆر بە ئاسانی لێی تێبگات.

لەم کتێبەدا زیاتر جەخت کراوەتە سەر بابەتە گرنگەکانی تەجوید، ئەو بابەتانەی کە زۆر دوبارە دەبنەوە لە قورئان، کە پێویستە بیانزانیت، وە لەهەر بابەتێک دا نمونەی زۆری تێدا نوسراوە بۆئەوەی کەسی خوێنەر بەئاسانی لێی تێبگات.

ئەم کتێبە جیاواز لە کتێبەکانی تر بە شێوازی (PDF) بەردەستە،

کە دەتوانی لەناو مۆبایل بە شێوەی کتێب لات بێت.

وە هەوڵدەدەین ئەو بابەتانەی کە باس نەکراون وەک (مخارج الحروف، وە بابەتەکانی تر....) لە داهاتودا کتێبێک لەسەریان بنوسین ان شاءالله.

## {چەند خاڵێکی گرنگ بۆ فێربوونی تەجوید بە ڕێگایەکی ئاسان}

**١-) بۆ فێربوونی تەجوید سەرەتا پێویستە لەلای مامۆستایەک ڕۆژانە دەرس بخوێنی، چونکە زۆر ئەستەمە تەنها بە خوێندنەوەی کتێبی تەجوید فێرببیت.**

**٢-) ئەگەر هیچ مامۆستایەکت لانەبوو، دەتوانی لە ڕێگای یوتوب (YouTube) سەیری**

**وانەکانی تەجوید بکەی، لەڕێگەی هەندێک مامۆستای زۆر باش و بەتوانا**

**وەک: (م.سەردار ناسر یان، م.تۆفیق صدیق، یان، م.دلێر گەرمیانی) کە هەریەک لەو مامۆستایانە سەرجەم وانەکانی تەجویدیان بە شێوەی زنجیرە داناوە.**

**٣-) ڕۆژانە ئەو وانانەی کە دەخوێنی بەردەوام دوبارەیان بکەوە، وە زۆر قورئان بخوێنە، وە زۆر گوێ لە قورئان خوێنەکان بگرە وەک: ( د.أيمن سويد، الحصري، المنشاوي، محمد أيوب)**

**چونکە چەند زیاتر گوێ لە قورئان بگریت زووتر وە باشتر فێری تەجوید دەبیت.**

**٤-) هەوڵدە ئەو بابەتانەی کە فێری بووی بڵاوی بکەوە وە خەڵکانی تریش فێربکە کە ئەمە یارمەتیت دەدات وانەکان لەبیر نەکەی وە زیاتر خۆت بەرەو پێش ببەیت، وە بۆئەوەی ببێتە تیشوویەک**

**(صدقة جارية) بۆ قیامەتت.**

**تێبینی:- ئێمەش چەند وانەیەکمان داناوە لە (یوتوب) کە هەموو بابەتەکانمان شەرح کردووەتەوە زۆر بە جوانی، کە دەتوانی لە ماوەیەکی زۆر کەم فێری تەجوید بیت.**

**یوتوبەکەمان بەناوی (بەهەشتی ئیمانداران).**

**- وە گرووپێکمان داناوە لە (تێلێگرام) بەناوی (بەهەشتی ئیمانداران) بۆئەوەی ئەگەر هەر بابەتێکی نوێمان بڵاوکردەوە یان هەر گۆڕانکاریەکمان کرد لەم کتێبە تۆش ئاگادار بیت وە ڕاستەوخۆ بۆتۆش بێت، وە هەوڵدەدەین لەم گروپە ڕۆژانە و بەردەوام شتی نوێ و بەسود دابنێین لە بابەتی تەجوید و بابەتی ئاینی و ڕەوشتی.**

**- داواکارم ئێوەش ئەم کتێبەی لاتانە بڵاوی بکەنەوە، بۆئەوەی ئێوەش بەشداربن لەم خێرە.**

# بابەتەکانی تەجوید


| ژمارە | بابەت | لاپەڕە |
|---|---|---|
| ١- | أحكام - ن – الساكنة | ٥ |
| ٢- | أحكام - م – الساكنة | ٩ |
| ٣- | أحكام المد [ ~ ] | ١١ |
| ٤- | أحكام الإدغام | ٢١ |
| ٥- | أحكام راء [ ر ] | ٢٤ |
| ٦- | أحكام لام (ل) | ٢٧ |
| ٧- | حروف القلقلة | ٣١ |
| ٨- | حروف الإستعلاء و الإستِفَال | ٣٣ |
| ٩- | حروف الهمس و الجهر | ٣٤ |
| ١٠- | شێوازەکانی خوێندنەوەی ناوی (اللّٰه) | ٣٦ |
| ١١- | شێوازەکانی خوێندنەوەی پیتی همزة الوصل (ٱ) | ٣٧ |
| ١٢- | هەندێک نیشانە لە قورئاندا | ٣٨ |




**أَحكَام - ن – السَّاكِنَة (ياساكانى نونى ساكين): له نونى ساكن و تەنوينەكان دروست دەبێت،**

**وەك: { ـً ، ـٍ ، ـٌ ، ن }**

**- أحكام -ن- الساكنة) له چوار بەش پێک دێت :**

## ( ١ ) إظهار (دەرخستن):

**له شەش پیت پێکهاتووه وەك: ( ء، هاء، ع، غ، ح، خ ). ئەگەر هاتوو لەدوای نونی ساكن یان تەنوینەكان { ـً ، ـٍ ، ـٌ ، ن } یەکێ له پیتەکانی (إظهار) هاتن، ئەوا ووشەکە وەکو خۆی دەخوێنینەوە و هیچ حەرەکەیەکی نادەینێ.**

**نمونه:-**

| | | | |
|---|---|---|---|
| عَزِيزٌ حَكِيمٌ | مِن غِسْلِينٍ | عَفُوّاً غَفُوراً | شَيءٍ عَلِيم |
| وَمَن أَعْرَضَ | وَمِنهُمْ دُونَ ذَٰلِكَ | وَهُمْ يَنهَوْنَ عَنهُ | نَزْلَةً أُخْرَىٰ |

## (٢) إقلاب (هەڵگەڕانەوە):

لە یەک پیت دروست دەبێت وەك پیتی (ب). ئەگەر هاتوو لەدوای نونی ساکن یان تەنوینەکان { ـً ، ـٍ ، ـٌ ، ن } پیتی (ب) هات، ئەوا نونی ساکن یان تەنوینەکان دەگۆڕین بۆ پیتی (م) وە لەگەڵ پیتی (ب) دەیلکێنین، وە دوو حەرەکەی دەدەینێ.

**نمونە:-**

| | |
|---|---|
| كَلَّا لَيُنبَذَنَّ | لَيُمبَذَن |
| مِنَ الأنبَاءِ | الأمبَاءِ |
| سميعًا بصيرا | سميعَمبَصيرا |
| زَوْجٍ بَهِيج | زَوجِمبَهيج |
| وَأَنبَتنَا فِيهَا | وَأمبَتْنَا |
| لَنسفعًا بِالنّاصِيَة | لنَسْفَعَمبِالنّاصِيَة |

## (٣)- إدغام (تێکهەڵکێش کردن)

لە (٦) پیت پێك دێت وەك: ( ي، ر، م، ل، و، ن)، کە پێیان دەگوترێت (يَرمَلُون) ئەگەر هاتوو لەدوای - ن - ساکن یان تەنوینەکان { ـً ، ـٍ ، ـٌ ، ن } یەکێ لە پیتەکانی (إدغام) هات وەکو (يَرمَلُون)، ئەوا تەنوینەکان یان نونی ساکن دەگۆڕین بۆ پیتەکانی (إدغام)، واتە تەنوینەکان یان نونی ساکن لەگەڵ پیتەکانی إدغام تێکهەڵکێش دەکەین، وە دوو حەرەکەی غونەی دەدەینێ.

- إدغام دەبێتە دوو بەش:

**أ-) إدغام بِغُنَة:** پێکدێت لە پیتەکانی **(ي، ن، م، و)** کە پێی دەگوترێت **(يَنمُو)**.

**نمونە:-**

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا | ← | مِنَّنَّفْعِهِمَا | وَلَيَكُوناً مِّنَ الصَّاغِرِينَ | ← | وَلَيَكُونَمِّنَ |
| إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ | ← | وَحْيُ يُوحَىٰ | فِيهِ ظُلُمَاتٌ وَرَعْدٌ | ← | ظُلُمَاتُوَرَعْدٌ |

{وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٌ (١) حَيۡثُ شِئۡتُمۡ رَغَدٗا وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا وَقُولُواْ حِطَّةٌ نَّغۡفِرۡ لَكُمۡ خَطَٰيَٰكُمۡ (٢) أَن يُؤۡمِنُواْ لَكُمۡ وَقَدۡ كَانَ فَرِيقٌ مِّنۡهُمۡ يَسۡمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ}

**ب-) إدغام بِلا غُنَة:** پێکدێت لە پیتەکانی **( ل، ر )**

**نمونە:-**

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| مِن لَّدُنۡهُ | ← | مِلَّدُنۡهُ | غَفُورٌ رَّحِيمٌ | ← | غَفُورُرَّحِيمٌ |
| هُدًى لِّلۡمُتَّقِينَ | ← | هُدَلِّلۡمُتَّقِينَ | مِّن رَّبِّهِمۡ | ← | مِرَّبِّهِمۡ |

**تێبینی:-** لە قورئاندا چوار وشە هەن کە نونی ساکن پیتەکانی **(إدغام)** لەدوایان هاتووە، بەڵام وەکو خۆیان دەخوێنینەوە وە نابنە **(إدغام)**.

**وەك:-** **(صِنوان، قِنوان، بُنيان، دُنيا)**

## (٤)- إخفاء (شاردنەوە)

لە (١٥) پیت پێك دێت، واتە جگە لە پیتەکانی (إظهار و إدغام و إقلاب) کە (١٣) پیتن، هەر پیتێکی تر دەبێتە پیتی إخفاء.

وەك:- (ت، ث، ج، د، ذ، ز، س، ش، ص، ض، ط، ظ، ف، ق، ك)

ئەگەر هاتوو لەدوای - ن - ساكن یان تەنوینەكان { ـً ، ـٍ ، ـٌ ، ن} یەكێ لە پیتەكانی (إخفاء) هات ئەوا وشەكە وەكو خۆی دەخوێنینەوە وە (٢) حەرەكەی غونەی دەدەینێ.

نمونە:-

| |
|---|
| {إِنَّهُ كَانَ مَنصُوراً} |
| {إِنَّ لَدَيْنَا أَنكَالاً وَجَحِيماً} |
| {هَذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ} |
| {وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا بِرِيحٍ صَرصَرٍ عَاتِيَةٍ} |
| {مَّن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللهَ قَرْضاً حَسَناً فَيُضَاعِفَهُ لَهُ أَضْعَافاً كَثِيرَةً} |
| {وَلَئِنْ أَذَقْنَا الإِنسَانَ مِنَّا رَحْمَةً} |
| {إِنَّهُ لَيَؤُوسٌ كَفُورٌ} |




أَحكَام – م - السَّاكِنَة (ياساكانى ميمى ساكين): له چوار بەش پێک دێت

## (١)- إدغام الشَّفَوي(تێكهەڵكێشكردنى لێوى):

له پيتى (م) دروست دەبێت، ئەگەر هاتوو پيتى (م) ى (ساكن) گەيشت بە پيتى (م) ى (مُتَحَرِك) ئەوا (إدغام الشفوي) دروست دەبێت، وە تێكهەڵكێشكردنى تەواو دەكەين، وە دوو حەرەكەى غونەى تەواوى دەدەينێ.

**نمونه:-**

| | | |
|---|---|---|
| {إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ} | {أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّاء مَّهِينٍ} | {الّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ} |
| {وَاللَّهُ مِن وَرَائِهِم مُّحِيطٌ} | {أُولَئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ} | {وَاللَّهُ أَنبَتَكُم مِّنَ الأَرْضِ نَبَاتاً} |

## (٢)-إخفاء الشَّفَوي(شاردنەوەی لێوی):

**لە پیتی (ب) دروست دەبێت. ئەگەر هاتوو پیتی (م)ی (ساكن) گەیشت بە پیتی (ب)ی (مُتَحَرِك) ئەوا (إخفاء الشفوي) دروست دەبێت وە تێكهەڵكێشكردنی تەواو دەكەین وە دوو حەرەكەی غونەی تەواوی دەدەینێ.**

**نموونە :-**

| | | |
|---|---|---|
| {وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ} | {سَلْهُم أَيُّهُم بِذَلِكَ زَعِيمٌ} | {لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ} |
| {فَإِذَا هُم بِالسَّاهِرَةِ} | {بَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ} | {أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ اللَّهَ يَرَى} |

## (٣)-إظهار الشَّفَوي(دەرخستنی لێوی):

**لە (٢٦) پیت دروست دەبێت. ئەگەر هاتوو (م)ی (ساكن) گەیشت بە هەموو پیتەكانی تر بێجگە لە پیتی (م، ب) كە پیتی (إدغام الشَّفَوي و إخفاء الشَّفَوي) یە، ئەوا وشەكە وەكو خۆی دەیخوێنینەوە و هیچ حەرەكەی نادەینی.**

**نمونە :-**

{لَكُم دِينُكُم وَلِيَ دِينِ}

{اللّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِم وَيَمُدُّهُم فِي طُغْيَانِهِم يَعْمَهُونَ}

{خَتَمَ اللّهُ عَلَى قُلُوبِهِم وَعَلَى سَمْعِهِم وَعَلَى أَبْصَارِهِم غِشَاوَةٌ وَلَهُم عَذَابٌ عظِيمٌ}

{وَسَقَاهُم رَبُّهُمْ شَرَاباً طَهُوراً}

{مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِم لاَ يَرْتَدُّ إِلَيْهِم طَرْفُهُم وَأَفْئِدَتُهُم هَوَاء}

{الْحَمدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ}

{خَاشِعَةً أَبْصَارُهُم تَرْهَقُهُم ذِلَّةٌ}

# أَحكَام المَد




**(مد) واتە درێژ کردنەوە، کە لە ٣ پیت دروست دەبێت وەك: ( أ، و، ي) ساكن بن، وە پیتی (أ) پێشی فەتحە بێت وە پیتی (و) پێشی ظەمە بێت وە پیتی (ي) پێشی کەسرە بێت.**

## (١)- مَد الطَبيعي

**دروست دەبێت ئەگەر هاتوو پیتی (أ، و، ي) ساكن بن، وە پیتی (أ) پێشی فەتحە بێت وە پیتی (و) پێشی ظەمە بێت وە پیتی (ي) پێشی کەسرە بێت، بەمەرجێک کە نابێت لەدوای پیتی ( أ، و، ي) دا پیتی (أ یان هاء) هاتبێت، وە دوو حەرەکە درێژ دەکەینەوە.**

**نمونه :-**

**{وَكَمۡ قَصَمۡنَا مِن قَرۡيَةٖ كَانَتۡ ظَالِمَةٗ وَأَنشَأۡنَا بَعۡدَهَا قَوۡمًا ءَاخَرِينَ}**

**{يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ}**

**{لَوۡ يَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمۡ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ}**

# (٢)- مَد العِوَض

دروست دەبێت لە پیتی (ء، أ) کە تەنوین فەتحە(ـً) لەسەریان بێت وە لە کۆتایی وشە بێت وە کاتێك کە لەسەری رابوەستین، ئەوا (٢) حەرەکە درێژ دەکەینەوە.

**نمونە :-**

| | | | |
|---|---|---|---|
| بِنَاءً ← بِنَاءَا | إنشَاءً ← إنشَاءَا | وَلِيَكُوناً ← وَلِيَكُونا | شَيئاً ← شَيئا |
| دُعَاءً ← دُعَاءَا | ضِيَآءً ← ضِيَآءَا | لَنَسفَعاً ← لَنَسفَعا | لَغْوًا ← لَغْوا |

تێبینی: ١-) ئەگەر لەسەر تەنوین فەتحە (ـً)ی کۆتایی وشە رانەوەستین و بەردەوامبین لە خوێندنەوە، ئەوا وشەکە وەکو خۆی دەخوێنینەوە و هیچ حەرەکەیەك درێژ ناکەینەوە، وە نابێتە (مَد العِوَض).

**نمونە:-** {إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ إِنشَآءً (١) فَجَعَلۡنَٰهُنَّ أَبۡكَارًا (٢) عُرُبًا أَتۡرَابًا(٣) لِّأَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ}

- ئەگەر لەسەر وشەی (إِنشَآءً) یان وشەی (أَبۡكَارًا) یان وشەی (أَتۡرَابًا) رانەوەستین و بەردەوام بین لە خوێندنەوە و لەگەڵ ئایەتی دوای خۆی لێکبدەین، ئەوا وشەکە وەکو خۆی دەخوێنینەوە و نابێتە (مَد العِوَض).

تێبینی: ٢-) ئەگەر جگە لە پیتی (ء، أ)، هەر پیتێکی تر تەنوین فەتحە(ـً)ی لەسەر بوو ئەوا لەکاتی ڕاوەستان درێژ ناکەینەوە بەڵکو وەکو خۆی دەخوێنینەوە.

**نمونە :-**

| | |
|---|---|
| ءَالِهَةً ← ءَالِهَه | سَوۡءٍ ← سَوۡء |
| نَافِلَةً ← نَافِلَه | زَفِيرٌ ← زَفِير |

تێبینی: ٣-) ئەگەر کۆتایی پیتی (أ) فەتحە(ـَ)ی لەسەر بوو لەجیاتی تەنوین فەتحە(ـً)، ئەوا لەکاتی ڕاوەستان دەبێتە (مد الطبيعي)، نابێتە (مد العِوَض).

**نمونە :-**

{عَبۡدِنَا، جَلَّىٰهَا، دَسَّىٰهَا}

# (٣)- مَد العارِض لِلسُّكُون

**دروست دەبێت لە پیتی ( أ، و، ي) کە ساکن بێت، وە دەبێت پیتی (أ) پێشی فەتحە بێت وە پیتی (و) پێشی ظەمە بێت وە پیتی (ي) پێشی کەسرە بێت، هاوشێوەی (مد الطبيعي). بەڵام (مد عارض للسكون) لەکاتی ڕاوەستان لەسەر وشە دروست دەبێت، وە دەبێت پیتی ( أ، و، ي) لەپێش کۆتایی وشەکە بێت. وە (٢، ٤، ٦) حەرەکەی درێژ دەکەینەوە.**

**نمونە :-**

| | | |
|---|---|---|
| {لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ} | {مِن رَّحِيقٖ مَّخۡتُومٍ} | {أَن لَّن يَحُورَ} |
| {مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡفُرۡقَانَ} | {وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ} | {يَوۡمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ} |

**تێبینی:- (مد عارض للسكون) دروست دەبێت لەکاتی ڕاوەستان لەسەر وشەکە، بەڵام ئەگەر بەردەوام بیت لە خوێندنەوە ئەوا دەبێتە (مد الطبيعي)، وە دوو حەرەکە درێژ دەکەینەوە.**

**نمونە:-**

{فِيهِمَا عَيۡنَانِ نَضَّاخَتَانِ (١) فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ}

**- ئەگەر لەسەر وشەی (نَضَّاخَتَانِ) ڕابوەستین ئەوا دەبێتە (مد عارض للسكون)، بەڵام ئەگەر بەردەوام بین لە خوێندنەوە و وشەی (نَضَّاخَتَانِ) لەگەڵ ئایەتی دواتر لێکبدەین، ئەوا وشەی (نَضَّاخَتَانِ) دەبێتە (مد الطبيعي)، وە دوو حەرەکە درێژ دەکەینەوە**

## (٤)- مَد الواجِب المُتَّصِل ( مد المُتَّصِل)
## - مَد الجائِز المُنفَصِل ( مد المُنفَصِل)

**هەردووک مەد دروست دەبن ئەگەر هاتوو پیتی (أ، و، ي)ى ساكن پیتی ( ء یان أ )ى مُتَحَرِك لەدوایان هاتبێت، وە (٤ تا ٥) حەرەکە درێژ دەکرێنەوە.**

**(أ) مد الواجِب المُتَّصِل ( مد المُتَّصِل): لە یەك وشە دروست دەبێ.**

**نمونە :-**

| | |
|---|---|
| {يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ} | {وَلَا ٱلۡمُسِيٓءُ} |
| {وَأَلۡسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ} | {كَمَن زُيِّنَ لَهُ سُوٓءُ عَمَلِهِ وَاتَّبَعُوا أَهْوَآءَهُم} |
| {وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطاً سِيٓءَ بِهِمْ} | {أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ} |

**(ب) مَد الجائِز المُنفَصِل (مد المُنفَصِل): لە دوو وشە دروست دەبێت، کە لە کۆتایی وشەی یەکەم پیتی (أ، و، ي) بێت وە لە سەرەتای وشەی دووەم پیتی (أ) بێت.**

**نمونە :-**

| | |
|---|---|
| {وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَآ أَعْبُدُ} | {سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٍ } |
| {قُلْ يَآ أَيُّهَا الْكَافِرُونَ} | { يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ} |
| {وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمُ} | { وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم } |

**تێبینی :- لە هەندێک بەڵگە هاتوە کە دەتوانی لە (مد الجائز المُنفَصِل) (٢، ٤، ٦) حەرەکە درێژ بکرێتەوە، چونکە ئەمەیان مەدی جائزە. بەڵام لە (مد الواجب المُتَصِل) دەبێت تەنها ( ٤یان ٥) حەرەکە درێژ بکرێتەوە.**

# (٥)- مَد الصِلّةَ الكُبرىٰ
# - مَد الصِلّةَ الصُّغرىٰ

## (أ)- مَد الصِلّةَ الكُبرىٰ:

**دروست دەبێت ئەگەر هاتوو پیتی (هاء) فەتحە(-َ) یان کەسرە(-ِ)ی لەسەر بوو وە لەدوای خۆی پیتی (ء یان أ) هات ئەوا (٤ تا ٥) حەرەکەی درێژ دەکەینەوە.**

**نمونە :-**

| | |
|---|---|
| { مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ} | {يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦ} |
| {إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ أَنَّا صَبَبۡنَا} | {يَحۡسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخۡلَدَهُۥ} |

## (ب)- مد الصِلّةَ الصُّغرىٰ:

**دروست دەبێت ئەگەر هاتوو پیتی (هاء) فەتحە یان کەسرەی لەسەر بوو وە لەدوای خۆی بێجگە لە پیتی (ء یان أ) هەر پیتێکی تر هات ئەوا (٢) حەرەکە درێژ دەکەینەوە.**

**نمونە :-**

| | |
|---|---|
| {وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ} | {إِنَّهُۥ عَلَىٰ رَجۡعِهِۦ لَقَادِرٞ} |
| {إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرٗا} | {مَا ٱبۡتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكۡرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَ} |

تێبینی: ١-) بۆ ناسینەوەی هەردووك مەدی (مد الصِلَة الکُبریٰ و الصُّغریٰ) لە قورئان هێمای پیتی بچوکی ( و،ـٚ ) کردوویانە، جا ئەگەر وشەکە پیتی(و، ـٚ)ی بچوک مەدی لەسەر بوو(~) ئەوا (مد الصِلَة الکُبریٰ) یە، بەڵام ئەگەر پیتی(و، ـٚ)ی بچوک مەددی لەسەر نەبوو ئەوا (مد الصِلَة الصُّغریٰ) یە، وەک نمونەکانی پێشتر.

تێبینی : ٢-) لە قورئان دا تەنها یەک وشە هەیە (تایبەتە) کە مەرجی (مد الصِلَة الصُّغریٰ) تێیدایە بەڵام هیچ حەرەکەیەک درێژ ناکەینەوە و وەکو خۆی دەیخوێنینەوە.

**نمونە:-**

{وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ لَكُمۡ} [سورة الزمر:٧]

تێبینی : ٣-) (مد الصِلَة الکُبریٰ و الصُّغریٰ) ڕوودەدات بەمەرجێك کە دەبێت پیتی(هاء) (مُتَحَرِك) بێت، وە پیتی پێش خۆی وە دوای خۆشی (مُتَحَرِك) بێت. بەڵام ئەگەر پیتی پێش (هاء) ساکن بێت ئەوا (مد الصِلَة الکُبریٰ و الصُّغریٰ) ڕوونادات، وە هیچ حەرەکە درێژ ناکەینەوە.

**نمونە:-**

{مَا ٱبۡتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ} {فَتَابَ عَلَيۡهِ إِنَّهُۥ} - هیچ حەرەکە درێژ ناکەینەوە چونکە پیتی پێش (هاء) ساکنە -

## (٦)- مَد اللازم الكَلِمِي
## - مَد اللازم الحَرفِي

**١- مد اللازم الكَلِمِي:** دەبێتە دوو جۆر

### (أ)- المُثَقَّل:(قورس)

**ئەم مەددە دروست دەبێت ئەگەر هاتوو لەدوای پیتەکانی مەدد (أ، و، ي) پیتێکی شەددەدار (-ّ) هاتبوو، ئەوا (٦) حەرەکە درێژ دەکەینەوە.**

**نمونە:-**

| | |
|---|---|
| {ٱلْحَاقَّةُ (١) مَا ٱلْحَاقَّةُ (٢) وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحَاقَّةُ}<br>{وَلَا ٱلضَّآلِّينَ}<br>{وَحَآجَّهُۥ قَوْمُهُۥ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي فِي اللهِ} | {فَإِذَا جَاءتِ الطَّآمَّةُ الْكُبْرَى}<br>{فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ} |

### (ب)- المُخَفَّف (سوک، باریک):

**ئەو مەددە دروست دەبێت ئەگەر لەدوای پیتی مەدد (أ، و، ي) پیتێکی ساکن هات، ئەوا (٦) حەرەکە درێژ دەکەینەوە، وە ئەم جۆرەیان لەقورئاندا تەنها دووجار هاتووە لە (سورَة يُونُس).**

**نمونە:-**

| | |
|---|---|
| {ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ} | [سورة يونس: ٥١] |
| {ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ } | [سورة يونس:٩١] |

## ٢- مَد اللازم الحَرفِي:

**ئەو مەددە بریتیە لەو پیتانەی کە لەسەرەتای هەندێک لە سورەتەکانی قورئان هاتوونە، کە لەکاتی نوسین بە (٣) پیت دەنوسرێن وە ناوەڕاستی یەکێکە لە**

**پیتەکانی مەدد(أ، و، ي)، کە ژمارەی پیتەکانی (٧)ە، وەک: (ن، ق، ص، ع، س، ل، ك، م)،**

**کە پێیان دەگوترێت : (نَقَصَ عَسَلُكُم).**

| | |
|---|---|
| ن | ← (نون) |
| ق | ← (قاف) |
| ص | ← (صاد) |
| ع | ← (عين) |
| س | ← (سين) |
| ل | ← (لام) |
| م | ← (ميم) |

**- دوو جۆری هەیە:**

**أ- المُثَقَّل(قورس): ئەو مەددە دروست دەبێت لەو پیتانەی کە لەکاتی نوسین بە (٣) پیت دەنوسرێن وە ناوەڕاستی یەکێکە لە پیتەکانی مەدد، وە تێکهەڵکێشکردن (إدغام) تێیدا روودەدات، وە (٦) حەرەکە درێژ دەکەینەوە.**

**ب- المُخَفَّف(سوك): ئەو مەددە هەمان شێوەی (مَد المُثَقَّل)ە، بەڵام جیاوازیەکەی ئەوەیە کە تێکهەڵکێشکردن (إدغام) روونادات. وە (٦) حەرەکە درێژ دەکەینەوە.**

تێبینی: ١-) ئەگەر لە کاتی نوسین پیتەکە بە دوو پیت بنوسرێت ئەوا دەبێتە (مد الطبيعي) وە (٢) حەرەکە درێژ دەکەینەوە، وە ژمارەی پیتەکانی (پێنج)ە وەک: (ح، ي، ط، ها، ر) کە پێیان دەگوترێت: (حَيٌّ طُهُر).

وەك: ( ر) ⟵ (را) | (ح) ⟵ (حا) | (ي) ⟵ (يا)

تێبینی: ٢-) پیتی (أ) سەربەخۆیە نابێتە جۆرێک لە (مداللازم الحرفي)، چونکە ناوەراستی پیتی ( ألِف) پێکدێت لە (ل)، کە (ل) یەکێک نیە لە پیتەکانی مەدد، بۆیە پیتی (أ) وەکو خۆی دەیخوێنینەوە.

وەك: (أ) ⟵ (ألِف) ---- (ل) - ليس لها كلمة المد -

**نمونە:-**

-{الٓمٓ} ⟵ أ: ليس لها مد ، ل: مَد المُثَقّل (إدغام)(٦حركة) ، م: مَد المُخَفّف (٦حركة).

-{الٓر} ⟵ ل: مَد المُخَفَّف (٦حركة) ، ر: مَد الطَّبِيعي (٢حركة).

-{كٓهيعٓصٓ} ⟵ ك: مَد المُخَفَّف(٦حركة)، ها: مَد الطَّبِيعي (٢حركة)، ي: مَد الطَّبِيعي (٢حركة)، ع: مَد المُخَفَّف (٦حركة)، ص: مَد المُخَفَّف (٦حركة).

-{طسٓمٓ} ⟵ ط: مَد الطَّبِيعي(٢حركة)، س: مَد المُثَقّل (إدغام)(٦حركة) م: مَد المُخَفَّف (٦حركة)

- {طه، مَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لِتَشۡقَىٰٓ} ⟵ ط: مَد الطَّبِيعي ها: مَد الطَّبِيعي(٢حركة)

-{صٓ، وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ} ⟵ صٓ: مَد المُخَفَّف(٦حركة)

-{قٓ، وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ} ⟵ قٓ: مَد المُخَفَّف(٦حركة)

-{نٓ، وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ} ⟵ نٓ: مَد المُخَفَّف(٦حركة)

## (٧)- مَد البَدَل

**مَد البَدَل:** ئەم مەددە دروست دەبێت ئەگەر هاتوو پیتی (ء) کەوتە پێش پیتی (أ، و، ي) ی مەدد، ئەوا (٢) حەرەکە درێژ دەکەینەوە.

**نمونە:-**

| | | |
|---|---|---|
| {أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ}<br>{وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ} | {هَلۡ ءَآمَنُكُمۡ}<br>{ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ} | {بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفۡسًا إِيمَٰنُهَا لَمۡ تَكُنۡ ءَامَنَتۡ مِن قَبۡلُ أَوۡ كَسَبَتۡ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيۡرًا} |

تێبینی:- لە قورئان دا ٣ وشە هەن کە وەك (مدالبَدَل) حیسابی بۆ دەکەین.

**نمونە:-**

(قُرءَانَ) ( مَسْئُولاً ) ( إِسْرآءِيلَ )

---

## (٨)- مَد اللِّين

**مَد اللِّين:** ئەو مەددە دروست دەبێت تەنها لە پیتی (و، ي) ی ساکن، بەمەرجێک کە لەسەری ڕابوەستین، کە ئەگەر هاتوو پیتی (و، ي) ساکن پێشیان فەتحە(-َ) بوو ئەوا بە ئەندازەی (٢،٤،٦) حەرەکە درێژ دەکەینەوە.

**نمونە:-**

| | | |
|---|---|---|
| {لِإِيلَٰفِ قُرَيۡشٍ} | {سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞ} | {هَٰذَا ٱلۡبَيۡتِ} |

تێبینی:- (مداللین) جیاوازی هەیە لەگەڵ (مدالعارض للسکون) لەڕووی دروستبونیانەوە(شێوازی ڕوودانیان)، وەک لە بابەتی سەرەوە باسمان کردووە.




## (١)- إدغام المُتَمَاثِلَين (تێکهەڵکێشکردنی هاوشێوەیی):

دروست دەبێت ئەگەر هاتوو دوو پیتی هاوشێوە لەدوای یەک هاتن، بەمەرجێك پیتی یەکەم (ساکن) بێت وە پیتی دووەم (مُتَحَرِك) بێت، پیتی یەکەم لەگەڵ پیتی دووەم تێکهەڵکێش دەکەین وە شەددە دەخەینە سەر پیتی دووەم.

**نمونە:-**

| | | |
|---|---|---|
| {يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ} | {فَمَا رَبِحَت تِّجَارَتُهُمْ} | {فَلاَ يُسْرِف فِّـي الْقَتْلِ} |
| {وَذَا النُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَاضِباً} | {قُل لاَّ أَشْهَدُ} | {قَدْ جَاءتْكُم مَّـوْعِظَةٌ} |

## (٢)- إدغام المُتَجانِسَين (تێكهەڵكێشكردنی هاوڕەگەز):

**دروست دەبێت لەكاتی بەیەكگەیشتنی دوو پیتی جیاواز كە هەمان دەرچەیان هەیە (دەرچەیان وەک یەکە و سیفەتیان جیاوازە)، بەمەرجێك پیتی یەکەم (ساكن) بێت وە پیتی دووەم (مُتَحَرِك) بێت، وە پیتی یەکەم تێكهەڵكێش دەكەین لەگەڵ پیتی دووەم وە شەددە دەخەینە سەر پیتی دووەم، ژمارەی پیتەكانی (٨) پیتن.**

**وەك: (ط، د، ت، ظ، ذ، ث، م، ب).**

**نمونە:-**

| (ب ← م) | (ت ← د) | (د ← ت) | (ت ← ط) |
|---|---|---|---|
| يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا | فَلَمَّآ أَثۡقَلَت دَّعَوَا ٱللَّهَ | قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ | وَدَّت طَّآئِفَةٌ |
| | قَدۡ أُجِيبَت دَّعۡوَتُكُمَا | وَمَهَّدتُّ | إِذۡ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ |

| (ط ← ت) | (ذ ← ظ) | (ث ← ذ) |
|---|---|---|
| لَئِنۢ بَسَطتَ | إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ | يَلۡهَث ذَّٰلِكَ |
| مَا فَرَّطتُمۡ | | |

## (٣)- إدغام المُتَقَارِبَين (تێكهەلكێشكردنى لێک نزيكەكان):

**دروست دەبێت لەكاتى بەيەكگەيشتنى دوو پيتى هاوشێوە كە هەمان دەرچەيان هەيە (دەرچەيان وەک يەكە و سيفەتيان وەک يەكە)، بەمەرجێك پيتى يەكەم (ساكن) بێت وە پيتى دووەم (مُتَحَرِك) بێت، وە پيتى يەكەم تێكهەڵكێش دەكەين لەگەڵ پيتى دووەم وە شەدده دەخەينە سەر پيتى دووەم. ژمارەى پيتەكانى (٤) پيتن، وەک: (ل، ر، ق، ک).**

**نمونە:-**

| (ل ← ر) | (ق ← ک) |
|---|---|
| بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِ | أَلَمۡ نَخۡلُقكُّم |
| وَقُل رَّبِّ | |

٨




## (أ)- حُرُف (ر) المُفَخَّمة ( پیتی - ر - گەورە):

شێوازی خوێندنەوەی پیتی (ر) بە گەورەیی(بەقورسی) وەک لەم خاڵانەی خوارەوە باس کراوە:

**١-)** ئەگەر (ر) فەتحە(-َ)ی لەسەر بوو:

| | |
|---|---|
| رَبُّهُم | رَبَّنَا |

**٢-)** ئەگەر (ر) ظەممە(-ُ)ی لەسەر بوو:

| | |
|---|---|
| رُسُلا | رُزِقنَا |

**٣-)** ئەگەر (ر) سکون بوو پێشی فەتحە بوو:

| | |
|---|---|
| العَرْشِ | أَرْبَاباً |

**٤-)** ئەگەر (ر) سکون بوو پێشی ظەممە بوو:

| | |
|---|---|
| المُرْسَلِين | يَومَئِذٍ زُرْقاً |

**٥-)** ئەگەر (ر) سكون بوو پیتی دوای خۆشی سكون بوو پێش خۆی فەتحە بوو:

{وَٱلۡفَجۡرِ (١) وَلَيَالٍ عَشۡرٖ (٢) وَٱلشَّفۡعِ وَٱلۡوَتۡرِ (٣) وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَسۡرِ }

**٦-)** ئەگەر (ر) سكون بوو پێشی همزة الوصل(ٱ) هاتبوو بوو ئەوا پیتی (ر) بە قوڕسی دەخوینیەوە:

{ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ}

{إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ}

{ٱرۡجِعۡ إِلَيۡهِمۡ فَلَنَأۡتِيَنَّهُم}

{قِيلَ لَكُمُ ٱرۡجِعُواْ فَٱرۡجِعُواْ}

تێبینی:١-) لەو نمونانەی سەرەوە پیتی (ر) كەسرەی لەژێرە بەڵام لەكاتی ڕاوەستان دەبێتە سكون.

**٧-)** ئەگەر (ر) سكون بوو پێشی كەسرە بوو، بەڵام لەدوای خۆی پیتەكانی (الإستعلاء) هاتبوون، وەك: ( ق، ص، ط) ئەوا پیتی (ر) بە قوڕسی دەخوێنینەوە:

**نمونە:-**

{كِتَٰبًا فِي قِرۡطَاسٖ فَلَمَسُوهُ}

{إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ}

{كُلِّ فِرۡقَةٖ مِّنۡهُمۡ}

{وَإِرۡصَادٗا لِّمَنۡ}

تێبینی:٢-) پیتەكانی (الإستعلاء) حەوت پیتن وەك (خُصَّ ضَغۡطٖ قِظۡ) بەڵام لەقورئاندا پیتی(ر) تەنها لەگەڵ سێ پیتی الإستعلاء (ط، ق، ص) هاتوە، وەک نمونەكانی سەرەوە.

## ب)- حُرُف (ر) المُرَقَّقَة ( پیتی - ر - ناسك):

**شێوازی خوێندنەوەی پیتی (ر) بە ناسکی(باریکی) وەک لەم خاڵانەی خوارەوە باس کراوە:**

**١-) ئەگەر (ر) کەسرەی لەژێر بوو:**

| | |
|---|---|
| {فِيهِ رِجَالٌ} | {وَفِى ٱلسَّمَآءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ} |

٢-) ئەگەر (ر) سکون بوو پێشی کەسرە بوو:

| | |
|---|---|
| {وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ} | {ولا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ} |

٣-) ئەگەر (ر) سکون بوو پیتی دوای خۆشی سکون بوو پێشخۆی کەسرەی لەژێر بوو:

| | |
|---|---|
| {ذِى ٱلذِّكْرِ} | {عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ} |

تێبینی:٣-) لەو نمونەی سەرەوە پیتی (ر) کەسرەی لەژێرە بەڵام لەکاتی ڕاوەستان دەبێتە سکون.

تێبینی:٤-) لە قورئان دا ٣ وشە هەن کە مەرجی (ر) ی ناسک لەسەریان جێبەجێ کراوە، بەڵام (ر) بە قوڕسی دەخوێندرێتەوە.

**نمونە:-** لەم سێ نمونەیە (ر) بە قوڕسی دەخوێندرێتەوە.

| | | |
|---|---|---|
| فِرْقٍ | قِطْرْ | مِصْرْ |




## ١- لام التَّعرِيف (لامی ناساندن):-

### (أ)- القَمَرِي:

**بريتييه له ئاشكراكردن و دەرختنی (لام) لەكاتی گەيشتنی بەيەكێک له پيته قەمەرييەكان كه (١٤) پيتن. وەك: ( ء، ب، غ، ح، ج، ك، و، خ، ف، ع، ق، ي، م، هاء)**

تێبینی:- (الإظهار القمري) واته (ال) كه لەسەرەتای وشه دێت و شەددەی لەدوا نەهاتووه.

**نمونه :-**

{فِى ٱلۡأَرۡضِ} {ٱلۡمُفۡسِدُونَ} {ٱلۡبَرۡقُ}

{هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَـٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ سُبۡحَـٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ (٢٣) هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَـٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ (٢٤)}.

## (ب)- الشَّمسِي:

**بريتيه له تێكهەڵكێشكردن و نەخوێندنەوەى (ال) لەكاتى گەيشتنى به يەكێک له پيتەكانى (الشَّمسِي) كه شەددەيان لەدوا هاتبێ.**

**وەك: ( ط، ث، ر، ت، ص، ذ، ن، د، س، ظ، ض، ز، ش، ل).**

**نمونه:-**

| |
|---|
| {ٱلنَّاسُ} {ٱلسُّفَهَآءُ} {ٱلصَّلَوٰةَ} {ٱلزَّكَوٰةَ} {ٱلرَّاكِعِينَ} |
| {ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلۡعَٰبِدُونَ ٱلۡحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِۗ}. |

## ٢- لام الفعل:(لامى كردار)

ئەم جۆرەى (لام) دەكەوێتە ناوەڕاست و كۆتايى وشه.

## (أ)- الإظهار (دەرخستن):

**ئەم جۆره ڕوودەدات ئەگەر هاتوو (لام) ساكن بوو (سكون لەسەرى بوو) وه لەدواى خۆى هەر پيتێک هاتبێت جگه له پيتى (ل، ر) ئەوا (لام) دەخوێندرێتەوه.**

**نمونه:-**

| |
|---|
| {وَلَايَلۡتَفِتۡ} {وَأَلۡقِ} {تَلۡقَفۡ} {فَأُلۡقِىَ} |

## (ب)- الإدغام (تێکهەڵکێشکردن):

ئەم جۆرەیان دروست دەبێت ئەگەر هاتوو پیتی (لام) ی (ساکن) بەدوای خۆیدا پیتی (لام یان راء) ی (مُتَحَرِك) هات، ئەوا تێکهەڵکێشکردن(الإدغام) ڕوودەدات.

**نمونە:-**

| | |
|---|---|
| {قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوۡمٍ}<br>{قُل لَّوۡ كَانَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَلَٰٓئِكَةٌ} | {وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمًا}<br>{وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنۡ هَمَزَاتِ ٱلشَّيَٰطِينِ} |

## ٣- لام الحَرف(لامی پیت)

ئەم جۆرە تەنها لە دوو وشە ڕوودەدات، وەک (هَلْ، بَلْ)

کە دەبێتە دووبەش:-

## (أ)- الإظهار (دەرخستن):

ئەگەر لەدوای وشەی (هَلْ، بَلْ) هەر پیتێکی تر هات جگە لە پیتی (لام یان راء) ئەوا (الإظهار) ڕوودەدات.

**نمونە:-**

| | |
|---|---|
| {هَلۡ نَحۡنُ مُنظَرُونَ}<br>{بَلۡ زَعَمۡتُمۡ} | {هَلۡ نَحۡنُ مُنظَرُونَ}<br>{بَلۡ زَعَمۡتُمۡ} |

## (ب)- الإدغام (تێکهەڵکێشکردن):

ئەگەر لەدوای وشەی (هَلْ، بَلْ) پیتی (لام یان راء) هات ئەوا تێکهەڵکێشکردن(الإدغام) روودەدات .

**نمونە:-**

{هَل لَّكُم } {بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِ}

تێبینی:- لەقورئاندا هیچ نمونەیەکمان نیە کە لەدوای وشەی (هل) پیتی (راء) هاتبێت.

## ٤- لام الإسم (لامی ناو)

ئەم جۆرە لامە لە ئەسڵدا (ساکن)ە وە لەناوەراست یان سەرەتای وشە دێت، وە دەرخستنی تەواوی دەدەینێ.

**نمونە:-**

| | |
|---|---|
| {أَلۡسِنَتِكُمۡ وَأَلۡوَ نِكُمۡ} | {فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا} |
| {وَزُلۡزِلُواْ زِلۡزَالًا} | {سَلۡسَبِيلًا} |

## ٥- لام الأمر (لامی کار)

ئەم جۆرە بریتییە لەو لامەی کەلە بنەڕەتی وشەکەدا نییە بەڵکو زیادە، دەچێتە سەر (فعل المضارع)ی سەرەتاو کۆتایی وشەکە تا بیکات بە کرداری فرمان(الأمر)، وە ئەم جۆرەی (لام)ە هەمیشە (ساکن)ە، وە لەپێشی دا وشەی (و، ف، ثُمَّ) دێت، وە دەبێت (لام) بەتەواوی دەربیبخەین.

**نمونە:-**

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| {وَلۡيَكۡتُب} | {فَلۡيَكۡتُبۡ وَلۡيُمۡلِلِ} | {وَلۡيَتَّقِ} | {فَلۡيُمۡلِلۡ} | {وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْ} |




**القَلقَلَة (لەرینەوە،هەژاندن): بریتیە لە لەرینەوەی پیتەکانی (قلقلة) کاتێک (ساکن) بوون، وە ژمارەی پیتەکانی پێنج پیتن، وەک : (ق، ط، ب، ج، د) کە پێیان دەگوترێت (قُطُبُ جَد).**

**قلقلة دەبێتە سێ جۆر:-**

## ١- القَلقَلَة الصُغرى (لەرینەوەی بچووک):

**ئەم جۆرەیان دروست دەبێت کە پیتەکانی (القَلقَلَة) لەناوەڕاستی وشە بێت.**

**نمونە:-**

| | | |
|---|---|---|
| {كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ} | {قَالَ فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا} | {وَيَقۡطَعُونَ} |
| {قَدۡ جَآءَكُم} | {يَدۡخُلُونَ} | {حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ} |

## ٢- القَلقَلَة المُتَوَسِط (لەرینەوەی مامناوەند) :

**ئەم جۆرەیان دروست دەبێت کاتێک پیتەکانی (القَلقَلَة) لە کۆتایی وشە بێن وە لەسەریان ڕاوەستین، بەمەرجێک کە شەددەیان لەسەر نەبێت.**

**نمونە:-**

| | |
|---|---|
| {مِن فُرُوجٍ} | {مُعۡتَدٍ مُّرِيبٍ} |
| {خَلۡقٍ جَدِيدٍ} | {وَرَآئِهِم مُّحِيطُۢ} |

**تێبینی: ١-) ئەو وشانەی سەرەوە (القَلقَلَة) تێیاندا ڕوودەدەن بەمەرجێک ئەگەر لەسەریان ڕاوەستین.**

## ٣- القلقلة الكبرى (لەرینەوەی گەورە) :

ئەم جۆرەیان دروست دەبێت کاتێک پیتەکانی **(القَلْقَلَة)** لە کۆتایی وشە بێن وە لەسەریان ڕابوەستین، بەمەرجێک کە **(شەددە)** لەسەریان بێت، واتە دەبێت شەددەدار بن.

**نمونە:-**

| | |
|---|---|
| {وَتَبَّ} | {ٱلْحَجُّ} |
| {ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلْحَقُّ} | {أَشَدَّ} |

تێبینی: ٢-) ئەو وشانەی سەرەوە (القَلْقَلَة) تێیاندا ڕوودەدەن بەمەرجێک ئەگەر لەسەریان ڕاوەستین.

تێبینی: ٣-) یەکەم: هەندێک کەسی قورئانخوێن هەڵە دەکەن لە بابەتی (القَلْقَلَة) لە هەندێک وشە، وەک لەکاتی ڕاوەستان دا پیتی (ء) ی بۆ زیاد دەکات.

**نمونە:-**

{ فَٱرْغَبْ} ← { فَٱرْغَبء} هەڵەیە ✖

{ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ } ← { لَمْ يَلِدْء وَلَمْ يُولَدْء } هەڵەیە ✖

تێبینی: ٣-) دووەم: زیاد کردنی شەددە بۆ پیتی (القَلْقَلَة) لەکۆتایی وشە لەکاتی ڕاوەستان لەسەری، کە ئەمەشیان هەڵەیە.

**نمونە:-**

{ مَآ أَعْبُدُ } ← { مَآ أَعْبُدّ} هەڵەیە ✖

{ إِذَا وَقَبَ } ← { إِذَا وَقَبّ } هەڵەیە ✖

{ ذَاتَ لَهَبٍ } ← { ذَاتَ لَهَبّ } هەڵەیە ✖

# حُرُوف الإِستِعلاء

## حُرُوف الإِستِعلاء (پیتەکانی بەرزی،قەڵەوی):

**بریتییە ئەو پیتانەی کە لەکاتی خوێندنەوەدا زمان بەرز دەبێتەوە بەرەو مەڵاشووی سەرەوە، وە وشەکان بە بەرزی و قەڵەوی دەخوێندرێنەوە، کاتێک (مُتَحَرِك) بن بە (فتحة، كسرة، ظَمة، سكون)، وە لە (٧) پیت پێکدێت،**

**وەک: (خ، ص، ض، غ، ط، ق، ظ)، پێیان دەڵێین: (خُصَّ ضَغطٍ قِظ).**

**تێبینی:١-)** ئەگەر پیتەکانی (حُرُوف الإِستِعلاء) سکون(-ْ) یان فتحة(-َ) لەسەری بوو ئەوا پیتەکە زۆر بەبەرزی دەخوێندرێتەوە.

**نمونە:** (أَقۡلَـٰمَهُمۡ) (يَخۡتَصِمُونَ) (أَضۡغَـٰثُ) (إِنَّا لَمُغۡرَمُونَ) (وَظَلَّلۡنَا) (بِٱلصَّبۡرِ) (وَٱلصَّلَوٰةِ) (طَيِّبَـٰتِ)

**تێبینی٢-)** ئەگەر پیتەکانی (حُرُوف الإِستِعلاء) ضمة(-ُ) لەسەری بوو ئەوا پیتەکە کەمتر بەبەرزی دەخوێندرێتەوە(سیفەتی (الإِستِعلاء) کەم دەبێتەوە).

**نمونە:** (غُلِبَتِ) (فَخُذُوهُم) (قُلُوبُنَا) (طُغۡيَـٰنِهِمۡ)

**تێبینی٢-)** ئەگەر پیتەکانی (حُرُوف الإِستِعلاء) كَسرة(-ِ) لەژێری بوو ئەوا پیتەکە زۆر کەمتر بەبەرزی دەخوێندرێتەوە(سیفەتی (الإِستِعلاء) زۆرکەم دەبێتەوە) یان هەندێک جار سیفەتی (الإِستِعلاء) لەدەست دەدات.

**نمونە:** (تَتَّخِذُوا) (وَٱلۡأَرۡضِ) (غِلۡمَانٌ لَّهُمۡ) (وَٱلۡبَصِيرُ)

{رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ رَبَّهُۥ}

{وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَـٰقَكُمۡ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَـٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذۡكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ}

{وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيۡطَـٰنَ وَلِيًّا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدۡ خَسِرَ خُسۡرَانًا مُّبِينًا}

**تێبینی:** بێجگە لە پیتەکانی (الإِستِعلاء)، گشت پیتەکانی تر دەبنە [حُرُوف الإستِفَال(نزم بوونەوە) ] کە بە نزمی و بە نەرمی دەخوێندرێنەوە و زمان بەرز نابێتەوە.

# حُرُوف الـهَمس

## حُرُوف الـهَمس (پیتەکانی چرپە،هەناسە):

بریتیە لەو پیتانەی کە لەکاتی خوێندنەوەدا بە نەرمی و ناسکی دەخوێندرێنەوە وە بە هەناسەیەکی کورت لەسەریان ڕادەوەستن و دەڕۆین کاتێک (سکون) لەسەریان بێت، لە (١٠) پیت دروست دەبێت.

وەک: (ف، ح، ث، هاء، ش، خ، ص، س، ك، ت)، کە پێیان دەگوترێت: (فَحَثَّهُ شَخصٌ سَكَت).

| | |
|---|---|
| أَفْ | أَصْ |
| أَحْ | أَسْ |
| أَثْ | أَكْ |
| أَشْ | أَتْ |
| أَخْ | أَهْ |

نمونە:-

| | | |
|---|---|---|
| {كُوِّرَتۡ}<br>{إِذَا تَنَفَّسَ} | {مَّثۡنَىٰ}<br>{ٱلرَّحۡمَٰنُ} | {قَدۡ أَفۡلَحَ}<br>{يَوۡمَئِذٖ يَصۡدُرُ ٱلنَّاسُ أَشۡتَاتٗا} |
| {ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ}<br>{أَكۡلٗا لَّمّٗا} | {لَبِثۡنَا}<br>{صَرَّفۡنَٰهُ} | {وَصِهۡرٗا}<br>{لَا يَشۡهَدُونَ} |

# حُرُوف الجَهر

## حُرُوف الجَهر (پیتەکانی ئاشکرا):

بریتیە لەو پیتانەی کە لەکاتی خوێندنەوەدا بە گەورەیی(قورسی) دەخوێندرێنەوە، وە پیتەکانی هەناسەیان لەگەڵدا نیە (یان هەناسەیەکی کەمی لەگەڵدایە)، وە بەجوانی وشەکە دەردەچیت، وە لەسەری ڕادەوەستین و دەڕۆین کاتێک (سکون) لەسەری بێت.

بێجگە لە پیتەکانی (الهَمس)، هەموو پیتەکانی تر دەبنە (الجَهر).

پیتەکانی: (أ، ب، ج، د، ذ، ر، ز، ض، ط، ظ، ع، غ، ق، ل، م، ن، و، ي)

کە پێیان دەگوترێت:- (عَظُمَ وَزْنُ قَارِئٍ غَضٍّ ذي طَلَبٍ جَدٍّ)

**نمونە:-**

| | | |
|---|---|---|
| أَءْ | أَضْ | أَمْ |
| أَبْ | أَطْ | أَنْ |
| أَجْ | أَظْ | أَوْ |
| أَدْ | أَعْ | أَيْ |
| أَذْ | أَغْ | |
| أَرْ | أَقْ | |
| أَزْ | أَلْ | |

{لَيَجْمَعَنَّكُم إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ}

{رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ}

{جُذُوعِ النَّخْلِ}

{يَا قَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ}

{ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ}

{أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ}

تێبینی:- زۆربەی قورئان خوێنەکان لەبابەتی (حُرُوف الهَمس و حُرُوف الجَهر) هەڵە دەکەن. وەک:

لەکاتی خوێندنەوەی پیتەکانی (حُرُوف الهَمس و حُرُوف الجَهر) پیتەکان دەکەنە (قلقلە) – (واتە پیتەکان دەهەژێنێت)، کە ئەمەیان هەڵەیە.

بەڵکو دەبێت پیتەکانی (حروف الهمس وە حروف الجهر) بەیەک ئاست و بێ هەژاندن بخوێنینەوە.

## شێوازەکانی خوێندنەوەی ناوی (اللّٰه)

١- ئەگەر لەپێش ناوی (اللّٰه)، فتحة(-َ) یان ظمة(-ُ) هاتبوو ئەوا ناوی (اللّٰه) بە قوڕسی(گەورەیی) دەخوێنینەوە.

**نمونە:-**

| | |
|---|---|
| {هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ} | {فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضٗا} |
| {فِي صُدُورِهِم مِّنَ ٱللَّهِ} | {نَسُواْ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمۡ} |
| {وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ} | {ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ} |

٢- ئەگەر لەپێش ناوی (اللّٰه)، کسرة(-ِ) هاتبوو ئەوا ناوی (اللّٰه) بە ناسکی (باریکی) دەخوێنینەوە.

**نمونە:-**

{مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ}

{ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ}

{سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ}

{قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ}

# شێوازەکانی خوێندنەوەی پیتی همزة الوصل (ٱ)

**١- ئەگەر پیتی همزة الوصل (ٱ) لەسەرەتای وشە هات، ئەوا تەماشای پیتی سێیەمی وشەکە دەکەین، ئەگەر پیتی سێیەمی وشەکە فتحة(-َ) یان کسرة(-ِ) بوو ئەوا همزة الوصل (ٱ) بە (إ) دەخوێنینەوە.**

**نمونە:**

| | |
|---|---|
| {ٱذۡهَب بِّكِتَٰبِى هَٰذَا} | ← { إِذۡهَب } |
| {ٱرۡجِعۡ إِلَيۡهِمۡ فَلَنَأۡتِيَنَّهُم} | ← { إِرۡجِعۡ } |
| {ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ} | ← { إِتَّخَذُوٓاْ } |
| {ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ} | ← { إِصۡبِرُواْ } |

**٢- ئەگەر پیتی همزة الوصل (ٱ) لەسەرەتای وشە هات، بەمەرجێک ئەگەر پیتی سێیەمی وشەکە ظمة(-ُ) لەسەری بوو ئەوا همزة الوصل (ٱ) بە (أُ) دەخوێنینەوە.**

**نمونە:**

| | |
|---|---|
| {ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ} | ← { أُدۡعُ } |
| {ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَ} | ← { أُرۡكُضۡ } |

**٣- ئەگەر لەپێش پیتی همزة الوصل (ٱ) یەکێ لە تنوین فتحة(-ً) تنوین ظمة(-ٌ) تنوین کسرة(-ٍ) هات، ئەوا تنوین فتحة(-ً) دەگۆڕین بۆ فتحة(-َ)، وە تنوین ظمة(-ٌ) دەگۆڕین بۆ ظمة(-ُ)، وە تنوین کسرة(-ٍ) دەگۆڕین بۆ کسرة(-ِ)، پاشان پیتی (نِ، ني) بۆی زیاد دەکەین و لەگەڵ وشەی دوای خۆی دەلکێنین و دەیخوێنینەوە.**

**نمونە:**

| | |
|---|---|
| {أَوۡ لَهۡوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيۡهَا} | ← { لَهۡوَنِنفَضُّوٓاْ} |
| {مِنۡ عَلَقٍ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ} | ← { عَلَقِ نِقۡرَأۡ } |
| {قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ} | ← { أَحَدُ نِللَّهُ } |
| {سَوَآءً ٱلۡعَٰكِفُ فِيهِ} | ← { سَوَآءَ نِالۡعَٰكِفُ } |
| { طُوًى ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ} | ← { طُوَ نِذۡهَبۡ} |
| {فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِ} | ← { فِتۡنَةُ نِنقَلَبَ } |

## هەندێک نیشانە هەن لە قورئاندا کە پێویستە بیانزانیت

١- ( ۩ ): نیشانەی (سُجدَةَ التِلاوَة)، کە سوننەتە سوجدە ببەی(سوننەتێکی چەسپاوە) کە باشترە ئەنجامی بدەیت.

مەرجەکانی سوجدەی تیلاوە:

- یەک سوجدە دەبەیت، - لە مەزهەبی (امام شافعي) هاتووە کە دەبێت (الله أكبر) بڵێی کە دەچیە سوجدە وە سەلام بدەیتەوە کە تەواو بویت، بەڵام بەپێی بەڵگەی (جمهور العُلَمَاء) بەڵگەی زانایان ئەوەیە کە تەنها سوجدە ببەی تەواوە.

- لەکاتی سوجدەکە سوننەتە ئەم زیکرە بڵێیت:(سَجَدَ وَجهِيَ لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ وَشَقَّ سَمعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَولِّهِ وَقُوَّتِهِ).

ئەگەر ئەم زیکرەشت نەزانی دەتوانی سێ جار بڵێی:( سُبحَانَ رَبِيَ الأَعلَى).

- دەبێت سوجدەکە لەکاتی خۆی لە شوێنی ئایەتەکە ببەی و نابێت دوای بخەی، وە ئەگەر لەناو نوێژدا گەیشتی بە سوجدەی تیلاوە ئەوا ڕاستەوخۆ سوجدە دەبەی و هەڵدەستیەوە و بەردەوام دەبیت لە نوێژ.

٢- ( م ): نیشانەی -م- کە پێویستە لەسەر ئایەتەکە ڕابوەستیت.

نمونە: {وَيَسۡخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۘ وَٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ}

٣- (س) نیشانەی -س- کە پێویستە لەسەر ئایەتەکە ڕابوەستیت(واجبه).

نمونە: {وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ} ------

{كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ}

**٤- ( ج )، (قلى)، (صلى):** دەتوانی لەسەر ئایەتەکە ڕابوەستی، وە دەتوانیت ڕانەوەستیت.

**نمونە:**

{وَأُمۡلِي لَهُمۡ ج إِنَّ كَيۡدِي مَتِينٌ}

{ثُمَّ تَكُونُ عَلَيۡهِمۡ حَسۡرَةً ثُمَّ يُغۡلَبُونَ قلى وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحۡشَرُونَ}

{مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ صلى لَا يَرَوۡنَ فِيهَا شَمۡسٗا وَلَا زَمۡهَرِيرٗا}

**٥- (لا):** نیشانەی نەوەستانە و نابێت بوەستین، وە ئەگەر لەسەر ئایەتەکە وەستاین دەبێت ووشەکە دوبارە بکەینەوە.

**نمونە:** {وَلَا يَرۡتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ لا وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ}

**٦- ( ∴ ∴ ):** نیشانەی وەستانە(واجبە)، کە ئەگەر لەسەر یەکێکیان وەستای دەتوانی لەسەر ئەوەیتر نەوەستیت.

**نمونە:** {ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَ ∴ فِيهِ ∴ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ}

{وَءَاخِرُ دَعۡوَىٰنا أَنِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ}

{وه دوا پاڕانەوەشمان ئەوەیە ئەڵێین سوپاس و ستایش بۆ
پەروەردگاری هەموو جیهان لەسەر ئەم هەموو نازو نیعمەتانە}